## باسی نەخۆشیەکانی گوێ ئەکات :

### ا- بۆ زەنگ وزرینگەی بەدرۆ وبێهێز بوونی گوێچارەی بەچەند هۆیەکە:

(١) ڕونی گوڵە سورو سرکە تێکەڵاو بکوڵێ تاسرکە دەسوتێو ڕونەکە ئەمێنی ڕۆژانە سێجار هەرجار، سێ دڵۆپ بەشیلتێنی لەگوێ بکرێ. (٢) ڕونی بەهی بەدڵۆپ لەگوێ بکرێ٠ (٣) ڕۆژانە چەند دڵۆپ ڕونی چەقەلە تاڵ لەگوێ بکرێ٠ (٤) لۆکە بەئاوی پیاز تەڕبکرێو لەگوێبندری یا ئاوی پیازبەدڵۆپ لەگوێ بکرێ یاپیاز گەرم بکرێو بەنیو گەرمی، لەسەر گوێ دابنرێ. (٥) بڕموتی زەنبەق کە لە جۆزەردان کرابێت ووشك کرابێتەوە، لەکەپو بکرێ٠ (٦) دە گرام پەلکی ئارتیشۆ لەلیترێك ئاوی کوڵاودا دەم بکرێو ڕۆژانە دووسەت و پەنجا گرامی لێ بخواتەوە٠ (٧) پینج تا دە گرام پەلکی بیە لیمۆ لەنیو لیتر ئاوی کوڵاودا دەم بکرێو ڕۆژانە چەند ئیستیکانی بەچەند کات لی بخورێتەوە (٨) ڕونی ئارویی تاڵ بەدڵۆپ ڕۆژانە لەگوێ بکرێ (٩) هەنجی ربەنەختێك خەرتەل بکوڵێو جوان پاك بکرێتەوە، ڕۆژانە دوو دڵۆپ لەگوێ بکرێ٠ (١٠) ڕەگی ئەریسا بکوڵێو ئاوەکەی بەسرکە لێك بدرێو ڕۆژانە یەك دڵۆپ لەگوێ بکرێ٠(١١) ڕونی ئاوکی خۆخ ڕۆژانە دڵۆپێك لەگوێ بکرێ٠ (١٢) بە دڵۆپ لەگوێ کردنی ئاوی سوسن٠ (١٣)

بە دڵۆپ لەگوێ˚کردنیئاوی ئەفسەنتین٠ (١٤) خواردنی سیر. (١٥) جاترە بگوشرێو ئاوەکەی بەڕونی گوڵەسور تێکەڵ بکرێ ڕۆژانە چەند دڵۆپ لەگوێ˚بکرێ˚ (١٦)بیست تا پەنجا گرام گیای بادرنجویە لەیەك لیتر ئاوی کوڵاودا بۆماوەی چەند خولەك دەم بکێشێو ڕۆژانە سێکات هەر کات یەك فنجانی لێ˚بخواتەوە٠

## ب- بۆ هاژە هاژو ووشە ووشی گوێ، چارەی بەچەند هۆیەکە:

(١)تۆزی پونگ لەکەپو بکرێ، ڕۆژی˚چەند جار تابپیکژی٠ (٢) پونگ لەسەر ئاگر بکوڵێ وسەر بە سەر هەڵمەکەی دابگری شتێکی ئەستوربەسەرخۆیدا بدا کە هەڵمەکە بچیتە ناو زارو کەپو وگوێی، تاسەرو گوێی ئارەقە ئەکا، ڕۆژانە چەند جار بەو شێوەیە (٣) تا نەخۆشیەکە لائەچی گەرماو نەکا لەپاش لاچونی نەخۆشیەکە ڕۆژانە گەر ماو بکا٠ (٤) ڕۆنی سوسن یا گوڵە سور ڕۆژانە لەگوێ˚بکا (٥) ڕۆژانە خۆبرسی نەکاو لە نێوان هەردوو کاتژمێرخواردن بخوا٠ (٦) سرکە بسوتێو گوێی بە سەردا بگیرێ تا دوکەڵ و هەڵمەکە بچیتە ناو گوێ (٦) دەرمانەکانی پیتی (ا)ینەخۆشیەکانی گوێ لەژمارە دوو وەتاکۆتایی شازدەم٠

## ج- بۆکردنەوەی گوێی گیراو،چارەی بەچەند هۆیەکە:

(١)سیرسیرە لەڕون دا بکوڵێو ڕونەکە پاك بکرێتەوەو ڕۆژانە دوو سێ جاربەدڵۆپ لەگوێ˚بکرێ٠

**د-بۆخوران و زیپکەی ناو گوێ، چارەی بەچەند هۆیەکە:**

(١)ناوکی زەردالو بکوترێ و لەناو ڕونی چەقەلەی تاڵ بکرێ و بۆچەند ڕۆژێك لە جێگایەکی گەرم دابنرێو جا ڕونەکە پاك بکرێتەوەو ڕۆژانە بەدلۆپ لەگوی بکرێ. (٢)نەفسەنتین و سرکە بە دلۆپ لەگوێ بکرێ،خوران لائەبا (٣) هەنجیرو خەرتەل پێکەوە بکولێن و هەرجار دوو دلۆپ لەگوێ بکرێ،خوران لائەبا٠

**هـ- بۆ گوێ ئێشان، چارەی بەچەند هۆیەکە:**

(١)خواردنەوەی، ئاولیمۆی تازە،لەخورێنیو پێش نوستن٠ (٢) چەند دلۆپ ناوی کولاوی، پەلکی چەوەندەر، بەنیو گەرمی، لەگوی بکرێ، یاناوی پەلکەکەی٠ (٣) ناوی ڕەگی ڕوکێش لەگوێ بکرێ٠ (٤) دلۆپێك مەڵحەمی گوڵیبەیبون لەگوێبکرێ٠ (٥) کاتی خەوتن یەك کەوچکی قاوە ڕونی چەقەلەی شیرن لەگوی بکرێ٠ (٦) ڕۆژانە چەند دلۆپ ڕونیچەقەلە تاڵ بەشیلتێنی لەگوی بکرێ. (٧) ڕۆژێ سێ کات هەرکات دوو دلۆپ ڕونی ناوکی قەیسی تاڵ لەگوی بکرێ (٨) لۆکە بەئاوی سیر تەڕ بکرێو لەگوێ بندرێ ئێشی بەهۆی ڕۆماتیزم و ساردی لائەبا (٩) جەعفەری خوێ بکرێ و بەڕونی زەیتون چەور بکرێو بەفتیلە لە گوێ بندرێ (١٠) پەنجا گرام ڕونی گوڵیسور، بیست و پێنج گرام ڕونی چەقەلەی شیرن، سەت و پەنجا گرام سرکەی کۆن لێك بدرێن و بکولێن تا سرکە لەناو ئەچی ورون ئەمینی، ڕۆژانە چەند جار بەدلۆپ لەگوی بکری (١١) پێنج تا دە گرام پەلکی بیەلیمۆ لەنیو لیتر ئاوی کولاوداد ەم بکرێو ڕۆژانە چەند ئیستیکانی لێ بخورێتەوە٠ (١٢) ئاوی پونگ وڕاوی هەنگوین لێك بدرێ بە دلۆپ لە

گوێ بكرێ. (١٣) ئاوی جاترە تێكەڵاو بەشیر بەدڵۆپ لەگوێ بكرێ. (١٤) دنكە سیرێكی سپی كراو لەسەر گوێی ئێشاو دابنرێ (١٥) ڕونی كاكڵی تاڵی ناوكی زەردالو ڕۆژانە سێ كات هەر كات دوو دڵۆپ لەگوێ بكرێ (١٦) قالۆچە ڕەشە لەڕۆنی زەیتون دا بكوڵێو ڕونەكە بە دڵۆپ لەگوێ بكرێ. (١٧) شیری ژنی كۆرپەی كچ بێت، بە دڵۆپ لەگوێ بكرێ. (١٨) پینج دنكە سیری كوتراو لەڕونی زەیتوندا بكوڵێو ڕۆژانە پینج شەش دڵۆپ ڕونەكە لەگوێ بكرێ. (١٩) بیست تا پەنجا گرام گیای بادرنجویە لەیەك لیتر ئاوی كوڵاودا بۆ ماوەی چەند خولەكێك دەم بكێشێو ڕۆژانە سێكات، هەر كات یەك فنجانی لێ بخواتەوە. (٢٠) خواردنی جاترەو پەنیر پێكەوە. (٢١) ڕۆژانە یەك دڵۆپ سركە لەگوێ بكرێ. (٢٢) ڕونی چەقەڵەی تاڵ بەشیلتێنی بەدڵۆپ لەگوێ بكرێ. (٢٣) ڕۆژانە تۆوی گژنیژبكوڵێ، بەهەڵمەكەی دم وچاوو گوێی پێ بخور بكرێن و لەهەمان ڕۆژ سێ چوار ئیستیكانی بەچەند كات لێبخورێتەوە . (٢٤) بەزی ڕێوی بتوێتەوەو بەدڵۆپ لەگوێ بكرێ. (٢٥) ئاوی كەوەر بە سركەو ڕونیگوڵ لێك بدرێو چەند دڵۆپ لەگوێ بكرێ. (٢٥)دڵی نێرەكێوی بگوشرێو ئاوەكەی لەگوێ بكرێ. (٢٦) زراوی مامز لەگوێ بكرێ.

## و- بۆخوێن هاتن لە گوێ:

- ئەگەر تاوگەرمی لەگەڵ بوو، چارەی بە:

(١)مازی بكوترێ و لەسركە دا بكوڵێوكەمێك كافوری تێ بكرێ وڕۆژانە سێ جار، هەر جار سێ دڵۆپ لەگوێ بكرێ.

- ئەگەر نەخۆش گەرمی نەبوو، تەڕی هەبوو، چارەی بە:

(١)كەوەر لەسركەدا بكوڵێو ڕۆژانە سێ جار بەدڵۆپ لەگوێ بكرێ٠

- ئەگەر گەرمی وتەڕی نەبوو،چارەی بە:

(١)كەوەر لەسركەدا بكوڵێو كەمێك كافوری تێبكرێ، ڕۆژانە سێجار بەدڵۆپ لە گوێ بكرێ٠

- هەنار ی مێخۆش لەسركە دا بكوڵێ بگوشرێ، ئاوەكەی ڕۆژانە بەدڵۆپ لەگوێ بكرێ بۆ هەموو جۆرەخوێن هاتنێك لەگوێ باشە٠

**ز- بۆ تەشەنە بوون وكرمی ناو گوێ،چارەی بەچەند هۆیەكە:**

- كەنیشانەی خوران و جولانەوەی كرمە لەناو گوێ٠

- ئەگەر گوێ بریندار بی یەكەم جار ئەبی بەمەڵحەمی سپی دەرمان بكرێ تا كو چاك ئەبیتەوە، جا:

(١)بورەو سەبری زەرد، كوتراوو تێكەڵاوو لێك دراو بەسركە ڕۆژانە سێ جار بەدڵۆپ لەگوێ بكرێ، لەپاش مردنی كرمەكان تۆزی پونگ یا بیبەر یاتوتن لەكەپو بكرێو خۆی پێ بپیكژێنیو كەپوو زاربگری تا هێزەكە بڕوا بۆگوێو كرمەكان فڕێ بدا٠

**ح- بۆگوێ یەك كەگیاندار یاهەزار پێی چوبیتە ناو:**

- كە نیشانەی ئێش و ئازارە بە قەبارەی جولانی خۆیو ئارام بوونە بەوەستانی٠

-چارەی بەچەند هۆیەكە:

(١)بە دەرمانی کرمی گوێ چارە ئەکرێ. (٢) ڕونی کونجی لەگوێ بکرێ، تا هەزار پێ دێتە دەر. (٣) سەبری زەرد لەئاوی گەرمدا بتوێتەوەو بە دڵۆپ لەگوێ ̍بکرێ، تا گیاندار دێتە دەر(٤) شیری ژنی کۆرپەی کچ بیت، بەدڵۆپ لەگوێ ̍بکرێ. (٤) ئاوی زاری بەڕۆژو لەگوێ ̍بکری ̍دێتە دەرەوە.

## گ- بۆئاو چونە ناو گوێکە نیشانەی:

وەرەم ونێشەلەقولاییگوێوهەست

بەوزەوزوزیپکەوگەرمیگوێنەکرێوبیستن بێهێزئەبێ.

## - چارەی بەچەند هۆیەکە:

(١)لەپی دەست بەکونی گوێوەبنێو لەسە رپێی لای گوێی ئێشاو ڕابوەستی و خۆی بجولینی. (٢) بەحوقنەی منداڵی بچووك ئاوەکە دەربینی. (٣) پارچە نیسفەنجێك فتیلە بکرێو لەناو گوێ بنرێو لەسەری درێژبی بۆماوەیەك وزوو فتیلەکە بگۆڕی. (٤)سۆندەیەکی باریك کەسەری نەرم بی لەگوێ بنری ̍بەزار هەڵمژی تا ئاوەکەی دەکێشی. (٥) زراوی نێریو زراوی گاجۆت لێك بدرێن و فتیلەیەك بەوتێکەڵاوە چەور بکرێو لەناو گوی ̍بنرێ بەرگری لەئاو چونە گوێ ئەکا.

## ی- بۆ لەجێ چونی گوێ‌چارەی بە چەند هۆیەکە:

(١)ئەبی یەکەم جار دەرمانی زگ چوون بە نەخۆش بدرێ و خوێنی کەم بکرێ (٢)هێواش هێواش گوی ̍بخرێتەوە جێگای خۆی و

بە پارچەیەك توند ببەسترێ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ. (٣) بەزی مراوی لەناودا بکوڵی و پێستی کدوی لەڕەندە دراوی تێ بکرێ‌وجوان لێك بدرێ و لەگوێ‌و دەورو بەری بندری ٗئێش لائەبا.

**ك- بۆ دەرهێنانی لم و بەرد لە ناو گوێ،چارەی بە چەند هۆیەکە:**

(١)چەند جار ڕونی نیو گەرم لەگوێ بکرێ جا لەسەر پێی لای هەمان گوێ ٗبوەست و خۆی بجولین. (٢) تۆزی بیبەر یاتوتن لەکەپو، بکاو زارو کەپوی ببەستی، وخۆی بپژمینی‌و سەری بەرەو هەمان گوێ خوار بکاتەوە. (٣) بەحوقنەی مندالّ یا سۆندە ڕابکێشری ٗلەو کاتە دەبی نەخۆش بوەستی‌و سەری بەلای گوێی نەخۆش خوار بکاتەوە.

**ل- بۆئاوسان وکیس کردنی‌گوێ،چارەی‌بەچەندهۆیەکە:**

(١) خاك شیرلەبناگوێ بندرێ (٢) شیری‌ژنی کۆرپەی‌کچ بی، بەدلۆپ لە گوی ٗبکرێ.

**م- بۆپاك کردنەوەی گوێ‌لەچلك:**

**-کەنیشانەی:** ئەگەر گوێ لە بەرامبەر تیشکی ڕۆژ ڕابگیری ٗچلکەکە دیارئەبێ.

**چارەی بەچەندهۆیەکە:**

(١) چەند ڕۆژێك ڕونی کونجی یا هەر ڕونێکی تر

بەنیو گەرمی کاتی نوستن لەگوی ٚبکرێ (٢) ئەبێ هەموو بەیانییەك گوێ بەسەر هەڵمی ئاوی کوڵیو دابگری، یا بەئاوی گەرم خۆی بشوا٠ (٣) ئەگەرچڵکەکە سەربەخۆ نەهاتەدەر دوای چەند ڕۆژ کەزانی چڵکەکەنەرم بووە بەکەوچکی تایبەتی گوێ چڵکەکە دەربینی (٤) سۆندەیەکی نەرم لەگوی ٚبخری ٚبمژری ٚتا چڵکەکە دێتەدەرەوە (٥)بە حوقنەی منداڵی بچووك چڵکەکە ڕابکێشری ٚبە هێواشی (٦) تۆوی ئیسپەندو بۆرەی ئەرمەنی جوان بکوترێن و بەسرکە فتیلە بکرێن و لەگوی ٚبندرێن بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەدوای یەك چڵکەکە دێتەدەر٠ (٧) ئاوی پیاز بەدڵۆپ لەگوی ٚبکرێ یا لۆکە لەئاوی پیاز بندرێو لەناو گوێ بندرێ یا پیاز گەرم بکرێو بەنیو گەرمی لەسەر گوی ٚدابندری ٚ(٨) ئاوی پەسیرەو سرکە لێك بدری ٚبۆسی ٚڕۆژ، هەر ڕۆژ دوو دڵۆپ لە گوێ بکرێ٠ (٩) ئاوی پەلکی بی بەدڵۆپ لەگوێ بکرێ (١٠) پیاز وورد بکرێو بکوڵێتا نزیکی زەردبوون ئەبی جا لێك بدرێ وەکو مەڵحەم و لەبناگوێ بندرێ٠ (١١) ئاوی موردی تازە بەدڵۆپ لەگوێ بکرێ (١٢) سماق لەئاوی گوڵ دا بخوسێ بۆ ماوەی چەند کاتژمێرجا بەدڵۆپ لەگوێ بکرێ٠

## ن- بۆکەڕی وگوێ گرانی:

-ئەگەر هۆیەکەی زگماکیو زۆرپیریو لێدانی بەهێز نەبووبی کە هۆیەکەی گەرمی

سروشت بێت **کەنیشانەی:** زەردی یا سوری دەم وچاوە، ئەگەر شتی سارد بەگوێوە بندری ٚهەست بەئارامیو کەم بونی ئێش ئەکا،

**چارەیبە:** (١) ئەبیٚ ئەو شتانە بەکاربێنی کە گەرمی، لەناو دەبەن سروشت، یەك دەخەن٠ (٢) هەنارێکی ترش کون بکریٚو بەزو دنکەکانی دەربهێنریٚو ڕونی گوڵە سورو کوندوری هێڕدراو وسرکەی لەناوبکرێن و جا دنکەکانیش تیٚبکر ێنەوە لە ناوزیلك یاجێگایەکی گەرم دابپۆشریٚ، تاناوهەنارەکە گەرم، وخەست ئەبیٚجا جوان تێکەڵ بکریٚو بپارزنی بۆناو شوشەیەکی خاوێن ڕۆژانە چەند جار بەنیو گەرمی دلۆپ دلۆپ لەگویٚ بکریٚ٠ ئەگەر هۆیەکەی ساردی وتەڕی بێت

کەنیشانەی: ئێش لەقولاٚیی گویٚیەهەست بەگرانی گویٚ ناکات ونەگەر شتی گەرم بەگویٚ وەبنیٚ هەست بەئارامی و کەم بوونی ئێش نەکا٠

چارەیبە:(١) سروشت ڕێك بخات بەخواردن و خواردنەوەی ئەوشتانەی ساردی وتەڕی کەم نەکەنەوە (٢) بەڕاوی هەنگوین و سەبری زەرد تێکەلاٚو ڕۆژانە غەڕ غەڕە بکریٚ٠ (٣) ڕونی شبیت ڕۆژانە بەنیو گەرمی دلۆپ دلۆپ لەگویٚ بکریٚ٠ (٤) بەیبون یاپونگ لەشتێك دا بکولیٚ، گوێی بەسەر هەڵمەکەدا بگری تا هەڵمەکەی بچێتە ناو گویٚ، بەو شێوە تا چاك ئەبێتەوە (٥) سرکە بسوتێنریٚو گوێی بەسەر دا بگیری تا دوکەڵەکە بچێتە ناو گوێی (٦) نوستوخددوس چوار میسقال کژنیژی ووشك، مەرزنجۆش هەریەك دوو میسقال موستەکی، هەلیلەی کابولی کوندور، هەریەك، یەك میسقال هەموویان جوان بهاردرێن بە دوونیستکان ڕاوی هەنگوین جوان لێك بدرێن ورۆژانە سیٚکات، هەر کات کەوچکێکی چای بخوات٠ (٧) ئاوی سۆتکە بە دلۆپ لەگویٚ بکریٚ، سوکی ئەکا٠

**س- بۆ هەمووجۆرەکەڕی وگوێ گرانیەك،چارەی بەچەندجۆریەکە:**

(١)ئاوی توربەڕاوی هەنگوین تێکەڵاو بکرێ وبەفتیلە لەناو گوێ بندرێ. (٢) ڕەگی سوسنی زەرد لەڕونی زەیتون دا بکوڵێ تا نەرم ئەبی، جا بگوشرێ و ڕونەکە پاك بکرێتەوە، بە دڵۆپ لەگوێ بکری کەڕیکۆن لائەبا٠ (٣) ڕونی توور بەیانی و ئێوارە لە گوێ بکرێ، کەڕی لائەبا٠ (٤) دوو دڵۆپ نەفت لەگوێ بکرێ، کەڕی و بای گوێ لائەبا (٥) سەری تور هەڵبگیرێ، ناوەکەی کلۆربکرێو ڕونی گوڵی سوری تێ بکرێلەسەر ئاگر دابندرێ، تائەکوڵێ، جابەشیلتێنی لەگوێ بکرێ٠ (٦) ئاوی پیاز بە دڵۆپ لەگوێ بکرێ یا لۆکە لەئاوی پیاز بندرێ و لە نا وگوێ بندرێ یا پیازگەرم بکرێو بەنیو گەرمی لەسەر گوێ دابندرێ، گوێ گرانی لائەبا (٧) سیرسیرە لە ڕونی دابکوڵێ وڕونەکە پاك بکرێتەوە ورۆژانە دوو، سێ جار بە دڵۆپ لەگوێ بکرێ، گوێ گرانی لائەبا٠ (٨) ڕۆژانە چەند جار هەرجار سێوێك لەقۆریەکی گچکە ئاوی بەسەردابکەی و سەرەکەی بەهەویری بگری ولەسەر ئاگری دابنێیو گوێی بەلولەکەیەوە بنێی تا هەڵمەکە بچیتە ناو گوێ وئارەقە بکات وببیتەوەوگوێ گرانی لائەچی٠ (٩) پارچە لۆکە یەك بەئاوی سیر تەڕبکرێو لە گوێیەك بندرێ کە بەهۆی، ڕۆماتیزم وساردی، کەڕبووە بۆ ماوەیچەند، رڕۆژ٠ (١٠) ڕۆژی سێ جار، هەرجار دوو قەترە ڕونی ئاروێی تاڵ لە گوێ بکرێ گوێ گرانی لائەبا٠ (١١) جاترەی تازەو نوی بکوترێو ئاوەکەی بگیرێو ڕۆژانە دوو جار هەرجارچوار قەترە لەگوێ بکرێ یا جاترە لەکەمێك ئاو دابکوڵێ جوان پاك بکرێتەوەو ئاوەکە بەدڵۆپ لەگوێ بکرێ، بەشێوەی ڕابردوو٠ (١٢) کەرپوچی تازەو

نویێو خاوێن وورد وورد بکری و لەسەر ئاگر سۆر بکرێتەوەو لەر شونیزەیتون بکریێو پاش ساردبوونەوە ڕونەکە پاك بکرێتەوەو ڕۆژانە سێ چوار دلۆپ لەگوی بکرێ گویێ گرانی لائەبا (١٣) ئیسپەند لە ئاوی تورو ڕونی زەیتون دا بکولێوجا پاك بکرێتەوەو ڕۆژانە بەدلۆپ لەگوی بکرێ، گوی گرانی لائەبا٠ (١٤) جاترە بگوشرێو ئاوەکەی بەڕۆنی گولەسوور تێکەڵ بکری ڕوژانە بەچەند دلۆپ لەگوی بکری کەڕی لائەبا (١٥) کەسانی کە گوێیان گرانەو باش گوێیان لی نابێت ئەبێت بەخواردنی ڕۆژانە یان ئاوی نارنج و پرتەقاڵ و لیمۆی ترش بخۆنەوە هەروها ماست و پەنیرو سەلات و هەموو جۆرە سەوزەیێك کە دەستکەوی بیکەنە خوادرنی ڕۆژانە (١٦) زراوی نێریو زراوی گاجۆت لێك بدرێن و فتیلەیەك بەوتێکەڵاوە چەور بکرێو لەناو گوێ بندرێ گوێ سوك ئەکا٠ (١٧) خوێنی گورگ و گوێز لێك بدرێو لەگوێی کەڕ بکرێ باشە (١٨) زراوی پیرۆزە بەدلۆپ لەگوێ بکری گوی گرانی کۆن لائەبا٠ (١٩) بەزی پیرۆزە بتوێتەوەو بەیانیو ئێواران بۆماوەی چەندڕۆژ بەدلۆپ لەگوێ بکری گوێ گرانی کۆن لائەبا٠

**ع- بۆنەخۆشیەکانیبناگوێ،چارەیبەچەند هۆیەکە:**

(١)ئاردی پاقلە، دە میسقال شملێووشك، سێ میسقا ل هەردوو، کوتراو بەنیو ئیستیکان ڕاوی هەنگوین تێکەلاو لەنەخۆشیەکە بندرێن ٠ (٢) نۆك بکوترێ و هەویر بکرێ لەبناگوی بندری ئاوسان و نەخۆشیەکان لەناو ئەبا٠ (٣) پەلکی گەزگەزکە، بەڕونی زەیتون بکولێو بخوری ماسینی بناگوێ چارە ئەکا٠

**ف- بۆنەخۆشی ئۆریۆن،چارەی بەچەندهۆیەکە:**

(١)پێویستە خواردنی خاوەنی نەخۆشیەکە شیرو شیربرنج بی. (٢) جیقی کۆتر بەپەلکی چەوەندەر بکوڵێو لەبناگوی بندرێ. (٣) پیازی نێر گز بکوترێو بەنەبات بهێردرێو لەسەر وەرەم دابندرێ. (٤) ئاوی نارنج و ئاوی پەسیرەو سرکە وەك یەك تێکەڵاو بکرێن و بناگوێی پێ چەور بکرێ (٥) کەمێك تاجریزی بکوڵێو ئاوەکەی پاك بکرێتەوەو بەئاوی گوشراوی شاتووی تازەلێك بدرێو وەرەمی‌بناگوێی پێ چەور بکرێ.

باسی نەخۆشیەکانی کەپو وچارەیان ئەکات:

ا- بۆبەتاڵ بونی ڕێگای هەوا،لەکەپو

کەنیشانەی هەست نەکردن بەبۆنی‌خۆش وناخۆشە چارەی بەچەند هۆیەکە ئەگەر زگماك نەبی˘(١) دەرمانی زگچونی خلتەکانی خەست بەکاربێنی (٢) ئەگەر پێویست بوو ئەسپونی هێڕاو بەسرکە هەویر بکرێو بەشێوەی فتیلە لەناو کەپو بندرێ٠

ب- بۆتەشەنەبون وهاتنی‌بۆنی‌بۆگەنی‌کەپو:

که بەهۆی زۆرتێربون و برسی بوونە، چارەی‌بەچەندهۆیەکە:

(١)سونبلی تیبی هاڕاو لەکەپو بکرێ تا لەناو ئەچێ. (٢) گوڵی سونبول و مێخەك بکوڵێن و ئاوەکەیان بەلوتی چەند جار هەڵ مژی٠

ج- بۆکەپوی‌گیراو

کەنیشانەی لە ژورەوەی سەر پەستان بۆ کۆتایی کەپو دێنی، وائەزانی کەگری˘یا گۆشتێکی زیاد لەکەپودا هەیەو هەناسەی بەزۆرو ئێش بۆ سەرەوە ئەڕوا

**چارەیبەچەندهۆیەکە:**

(١)هەنجیر بکولێنیّو ناوەکەی پاك بکەیەو ەوراوی هەنگوینی تی ٘بکەیو بیکولێنی تاهەنگوین و ئاوەکە بەتەواوی خۆلێك ئەدەن ڕۆژانە چەند جار غەرغەرەی پیّ بکریّ، تا چاك ئەبیّ۰ (٢) بەیبون یا خەرتەل لەقۆریدا بکولیّو کەپوی بەسەردا بگیریّ تا هەڵمەکە بچیتە ناو کەپو ڕۆژانە چەند جار۰ (٣) دوای بونەوەی کەپو ئاوی چەوەندەر بەدڵۆپ لەکەپو بکریّ۰ (٤) تۆزی بیبەرلەکەپو بکریّ تا بپیکژیّ (٥) ڕونی چەقەلەی تاڵ لەگەڵ کەمێك بیبەری سپی تێکەڵ بکریّو بەدڵۆپ لەکەپو بکریّ۰ (٦)سروشت بەخواردنی نەرم کەر بەنەرمی ڕابگیریّو چاودێری سروشتیو سارد بکریّ. (٧) هەردەم شوتنی کەپو بەئاوی کولاّوی بنەوشە. (٨) ڕۆژانە چەند جار شوتنی کەپو بەئاوی کولاّوی بەیبون. (٩)بۆن کردنی تور. (١٠) دڵۆپ دڵۆپ لەکەپوو کردنی ئاوی ئاروی٘(١٠) درێژە بەدەرمانەکان بدری٘تا لاچونی نەخۆشیەکە۰

**د- بۆنپیکەوبرینیناوکەپوو چارەیبەچەند هۆیەکە:**

(١)مۆمی زەرد لەناو ڕونی چەقە لەدا بتوێتەوەو تێکەڵ بکریّ، ناو کەپوی پیّ چەور بکریّ تا چاك ئەبی۰ (٢) ئاوی نیوگەرم هەڵمژیو کەپوی پی٘بشوا۰ (٣) سوربی سوتاو بەڕونی گوڵی سور تێکەلاّوو لێك دراو ناو کەپوی پی٘چەور بکریّ ئەگەر ناو کەپوو وشك بی بەبەزی مراوی یا ڕونی نیلوفەر یا مەڵحەمی سپی، ناو کەپو چەور سبکریّ۰

## هـ- بۆبەرگری‌لەهاتنی‌خوێنی کەپو:

- ئەگەر نەخۆش لەچۆنیەتێیکی ترسناك و ئەوپەڕی نەخۆشی‌دا بی، بەرگری لە و کاتەدا ناکرێ مەگەربەهۆی زۆرخوێن هاتن مەترسی گیان لەدەست دان هەبی، لەو کاتە بەرگری ئەبی بکرێ٠

- ئەگەربەهۆی گەرما، تاو، ماندووبوون، بێهێزی بی چارەی بەچەند هۆیەکە:

(١)ئاوی زۆر سارد بەزۆری بەتەپڵی سەری‌دا بکرێ٠ (٢) گەچ بەسرکە هەویربکرێ و لەجومجومەی سەر بنرێ(٣) ئاوی گژنیژ٠ (٤) شەنی هێڕدراو٠ (٥) تۆزی گەچی ددان ساز (٦) تۆزی نیسکی هاڕاو٠ (٧ ) کوندوری هاڕاو (٨) کافور (٩) تۆزی گوڵناری هاڕاو٠ (١٠)تریاکی هاڕاو٠ (١١) ئاوی پونگ٠ (١٢) ئاوی تەرسی کەرێ٠ ★هەریەك لەمانە دەست کەوێ لەکەپو بکرێو هەڵمژێ بەرگری لەخوێن هاتن ئەکا٠ (١٣) پیاز ڕەندە بکرێو چەند دڵۆپە سرکەی بەسردا بکرێو لێك بدرێو بپارزنێو ئاوەکەی لە کەپوبکرێ یا یەك دڵۆپە سرکە بەتەنها لەکەپو بکرێ٠ (١٤) پیاز ڕەندە بکرێو چەند دڵۆپە ئاوی لیمۆی بەسەردا بکرێو لێك بدرێو ئاوەکەی لەکەپو بکرێ٠ (١٥) بەستنی هەردوو باسك و شێلانی گوێیان و هێلکەگونان و ئەگەر ژن بیت هەردوومەمکان هەردوولا جانگێکی سەر٠ (١٦) چەور کردنی نیوچاوان

بەگولاَوو کافور(١٧) گەچی کۆنی دیوار بەئاو ھەویر بکرێو لەسەر برۆیان بنری`(١٨) سپێنەی ھێلکەی مریشك بەلۆکە فتیلە بکرێو لەکەپو بنرێ٠ (١٩) لەکەپو کردنی تۆزی گوڵی شەقایق (٢٠) خوادرنەوەی ئاولیمۆی تازە لەخورێنیو کاتی نوستن (٢١) لەکاتی خوێن ھاتن دووسێ دڵۆپ ئا ویا دۆشاو یاشەرەبەتی پەسیرە لەکەپو بکرێ٠ (٢٢) لۆکە بەئاو لیمۆ تە ڕ بکرێو لەکە پو بنرێ. (٢٣) ئاوی میوە یا دەمکراوی ئیجاص شائیك بەکەپو ھەڵمیسێو تێ ومر بکرێ٠ ( ٢٤) مشکی سوتاوی قۆچی گا لەکەپو بکرێ٠ (٢٥) مشکی سوتاوی قۆچی گەوەزن لەکەپو بکرێ٠ (٢٦) خوێن لێھاتووەکە ناوی خۆی بەخوێنەکە بنووسی ولەبەرامبەرخۆی ڕابگریو تەماشای بکا تاخوێنەکە ئەوەستی٠

## و- بۆبە رگریلە ھاتنی ئاوی کە پووھە لامەت (پەسیو) چارەیبەچەند ھۆیەکە:

(١)بۆ یەکەم جارچەند ڕۆژغەڕغەرە بەگولاَو بکەن وخواردنە کانی سوك و ھێزدار بخۆن و خۆ بپارێزن لە خوادرنی پەنیرو گوێز سەریگەرم داپۆشیو ئەگەرئاوھاتنی کەپو زۆربی`بخور بە، بابونەی شیرازی، ناوکی ناخونەك و بنەوشۆکە، بکری`(٢) ھەڵمژینی پیاز

بەکەپو بۆ هەلأمەت باشە (٣) ئاوی یەك پرتەقاڵ لەفنجانێك بکرێ ودووکەڵپە شەکرو یەك کەوچکی چا ئاوی لیمۆی تێبکرێو فنجانەکە بەئاوی کولأو پڕبکرێو کاتی نوستن بخورێتەوە یا بەبێ لیمۆ نەگەرنەبوو٠ (٤) بۆن کردنی گوڵی نێرگز بەزۆری لەزستان٠ (٥) ڕۆژانە خواردنی لیمۆ یا ئاو لیمۆی تازە لە خورێنیو کاتی نوستن (٦) هەڵمژینی هەڵمی گوڵ و گیای بەیبونە بەکولأوی (٧) هەڵمژینی تۆزی ووشك کراوەی گوڵی حاجیلە. (٨) ئاوی کولأوی بنەوشە بخورێتەوە. (٩ ) بخورکردن بە سەندەروس و شەکر٠ (١٠) بخور کردن بەشەکر٠ (١١) نیوئیستیکان ئاولیمۆبەنیوئیستیکان ئاوی گەرم، وکەوچکێك هەنگوین تێکەڵأو لەخورێنی بخورێتەوە. (١٢)ڕۆژانە خواردنەوە، وبخور کردن بەگوڵی زمانەگا هەلأمەت و ساردی لائەبا٠ (١٣) ڕۆژانە دوو جار، هەرجاریەك کەوچکی چای گیای مریەم گوڵی لەناو یەك فنجان ئاوی کولأودا دەم بکێشیو بخورێتەوە٠ (١٤) شەوانە لەژورێکی قەپاتدا قاپێك لەسەر ئاگر دابندرێو پەلکی پونگی تێ بکرێ٠ تا بخور نەکاو زوورە کە پڕنەکا جانەخۆشەکە لەوێ دا بخەوی تایبەت بۆمنداڵ٠ (١٥) هەر کەس بیەوێ لەزستان هەلأمەت نەگری، هەر ڕۆژ لەخورێنی کەوچکێك ڕاوی هەنگوین بخواتەوە٠ (١٦)زۆر بەکار هێنانی جاترە بەدەم کراوی یا لەگەڵ خواردن تێکەلأو یا بە بخور زۆر باشە٠ (١٧)

ڕەشکەی بۆ دراو بکوتی بەڕونی زەیتون تێکەڵاو دڵۆپ، دڵۆپ لەکەپو بکرێ· (١٨) ڕۆژانە سێ ئیستیکان ئاوی دەم کراوی گوڵی بەیبون بەسێکات (١٩) ئاوی گوشراوی ڕیحان تێکەڵاو بەشیر· (٢٠) گوڵی هەمووجۆرە سوسنێك ووشك بکرێتەوەو بکوترێو بکری بەبرِموت ورۆژانە چەند جار بەکەپو هەڵمیسی· (٢١) ڕەشکە جوان بکوڵێنیو پارچە قوماشێکی لەناودا جوان تەر بکەیو بەگەرمی لەسەرسەریدا بنێی·

## ز- بۆلابردنیگریپ، چارەیبەچەندهۆیەکە:

(١)خواردنی بەهێ (٢) خواردنەوەی دارچینی دەمکراو بەتەنها یا تێکەڵ بەزەنجەفیل (٣)ئاوی پرتەقاڵ بەشەکر· (٤) خواردنی پیازی کوڵاوو برژاو (٥) ڕەشکە بکوترێو هەویربکرێ گەرم بکرێ لەسەرو ناو چاوان بندرێ (٦) جەعفەری وورد بکرێو لە شیری کوڵاو بکرێو جابەگەرمی بخورێتەوە (٧) بۆماوەی سێ ڕۆژ تەنها خواردنی سێوی ڕەندە کراو. (٨) خواردنی خورما. (٩) خواردنەوەی شەربەتی سێو. ( ١٠) پونگی ووشك کراوەو کوتراو لەشلەو دۆو شتیوا دابکرێو بخورێتەوە (١١) خواردنی تەڕەتولە (١٢) ئاوی گیای بۆمادەران لەکەپو بکرێو هەڵی مژی· (١٣) گوڵی هێرۆ و ناوکەکەی وەك چا دەم بکرێو

بخورێتەوە٠ (١٤) خواردنەوەی جاترە بەپرپۆڵە وەیان سەر بەسەر داگرتنی٠ (١٥) خۆلنجان وەکوچای دەم بکرێو بخورێتەوە (١٦) پازدە گرام بەرگی بولە بەچل گرام توێلکی نارنج پێکەوە بکولێو بپارزنێو ئاوەکە بخورێتەوە (١٧) ڕۆژانە خواردنی سیر(١٨) بۆن کردنی ڕەشکە بەدەوام (١٩) ڕەشکە نیوە کوتراو بکرێ و چەند قەترە خوێئاوکی بەسەر دابکرێو لەسەرو ناوچاوان بندرێ٠ (٢٠) ڕەشکە بەساغی گەرم بکرێ لەسەرو ناو چاوان بندرێ٠ (٢١) بیست گرام ڕیحان لەناو یەك لیتر ئاوی سارد بکولێ بۆ چەند خولەك جا پاك و سارد بکرێتەوەو بەشەکر یا هەنگوین شیرن بکرێو ڕۆژانە بەچەند قوم بخورێتەوە، گریپ وتاو نەخۆشی لائەبا. (٢١)ناوکی مێووژد مربێو دنکە بیبەرەکی ڕەشی لەناو بنرێو بخورێ چلك و تەڕی لائەبا٠

## ح- بۆ هێنانیپیکژین و فرێ دانیچلمی ناوکەپو:

(١)تۆزی خەرتەل لەکەپو بکرێ٠ (٢) ئاوی چەوەندەر بەڕاوی هەنگوین لێك بدرێو بەدلۆپ لەکە پوبکرێ (٣) ناوکی مێوژ دەربێو دنکی بیبەری ڕەشی لەناو بنرێو بخورێ (٤) هەلمیسین و لەکەپو کردنی تۆزی ڕیحانەکێوی کوتراو٠ (٥) هێلی کوتراو لەکەپو بکرێ٠ (٦) ئاردی بیبەری سەوز هەلمژێ٠

**گ- بۆبەرگری لەپیکژینی زۆر، چارەی بەچەند هۆیەکە:**

(١)خواردنی خیار. (٢) خواردنی تەرمتوله. (٣) بۆن کردنی گوڵی نێرگز. (٤) ڕەشکەی بۆدراو بکوتی و بەڕونی زەیتون تێکەڵاو دڵۆپ دڵۆپ لەکەپو بکرێ.

## باسی جوان بوونی دم و چاو ولابردنی زیپکه وله ککه وڕاوی دم وچاو ئەکات

أ- بۆجوان بوون وڕێك خستنی لوێچی دم وچاو، چارەی بەچەند هۆیەکە:

(١) ئاوی پیازو ئارویّو ڕاوی هەنگوین، لێك دراو دم و چاوی پێ چەور بکرێ. (٢) کێشی هەشت حەببە خەرتەلی کوتراوو لێك دراو بەشەمیّو ڕون دم وچاوی پی چەور بکری (٣) زرشك و عیناب هاو سەنگ بکولێن و بۆ ماوەی دە ڕۆژ ئاوەکە بخورێتەوە بۆ سروشت گەرمان. (٤) ڕۆژانە خواردنی کەلەم بەکولاویو خاوی. (٥) هەر ڕۆژ سێ کات خواردنەوەی گولی زمانەگا. (٦) چەور کردنی دم و چاو بەئاوی کولاو یا خوساوی نۆك. (٧) خوساندنی مێخەك لەئاوی ئارویّدا، بۆماوەی بیست و چوار کات ژمێر، جا ئاوەکەی بخورێتەوەو شیرن بکرێ تەنها یابە هەنگوین. (٨) توێلکی بەهی پازدە ڕۆژ لەسپرتۆدا بخوسێ، جادم و چاوی پێ چەور بکرێ، چرج و لوێچی پیری لائەبا. (٩) خواردنەوەو تێدانی ئاو یا دۆشاویاشەربەتی پەسیرە. (١٠) ڕۆژانە لەخورێنی خواردنی ڕەشکەی لێك دراو بەڕونی زەیتون یا ڕەشکە. (١١) جاترەی شیرازیو هەنجیری ووشك بەیەکەوە بخورێن (١٢) مەلحەمی دروستکراو بەئارویّو هەنگوین و کەمێك مێو دم وچاوی پێ

چەور بکرێ، نەرم وجوانیان ئەکا٠ (١٣) تێدانی ئاوی خیار شەمبەر. (١٤)مۆز سپی بکرێو بەئاوو تۆوی گندۆرە لێك بدرێ و لەدم و چاوان هەڵبسوێ (١٥)خواردنی نۆکی کوڵاوو برژاو (١٦) خواردنی سۆتکە یا بەکار هێنانی وەکو سابون(١٧) تێهەڵسوینی توێلکی گندۆرە، تایبەت ژنان لەگەرماودا. (١٨) لۆکە بەئاوی تری٘تەڕ بکرێو دم و چاوی پێ چەور بکرێو دوای دە خولەك دم وچاو بەئاوی شیلتێن بشۆری٘ (١٩) ڕۆژانە سێ جار دم و چاو بەڕونی تری٘چەور بکری٘(٢٠) شوتنی دم و چاو بەئاوێك بۆ ماوەیەکی زۆر نۆکی تێدا خوسابی٠ (٢١) ماست هەڵسون لەدم و چاو پێستی نەرم وجوان ئەکا٠ (٢٢) زیرە بەکوڵاوی یا بەخوساوی بەماست تێکەڵاو بکرێو لەدم و چاو هەڵبسوێ. (٢٣) ڕۆژانە چەند جارچەورکردنی، دم و چاو بەڕونی چەقەلە تاڵ. (٢٤) خواردنی خورما (٢٥) خواردن و خواردنەوەی بیبەری هاڕاو، تایبەت سارد سروشتان (٢٦) تۆوی ڕازیانە، لەئاودا بخوسێو ڕۆژانە، دم و چاوی پی٘بشۆرێ، چاویشی پێ جوان و ڕووناك ئەبن٠ (٢٧) خواردنی ڕەشکە پێستی دم وچاوو بەدەن سۆروجوان ئەکا٠ (٢٨) خواردنی زەردەچەوە٠ (٢٩) خواردنی پەلکی ڕازیانە پێستی، دم و چاووبەدەن سۆروجوان ئەکا٠ (٣٠) چەور کردنی دم، و چاوو پێستی، بەدەن بەمیوەی، چیالیك جوانیان ئەکا. (٣١) یەك دەسکی گەورەی جەعفەری لەدوو سەتوپەنجا گرام ئاودا بکوڵێو بۆماوەی یەك هەفتە دم و چاوو لەشی پێ بشۆرێ٠ (٣٢) دم و چاو بە سپیاوی قەلع چەور بکرێ. (٣٣) ڕۆژانە خواردنی هەرمێ، تایبەت لەخورێنی. (٣٤) ڕۆژانە خواردنەوەی ئاو لیمۆ (٣٥) وپرتەقاڵ (٣٦) خواردنی شیری بزنوشەکر پێکەوە ڕەنگی دم و چاو جوان ئەکا٠

## ب- بۆزیپکەی‌جاحێڵی‌ولەککەوپەڵەوخاڵی‌دم وچاو،چارەی‌بەچەند هۆیەکە:

(١)ئاردی گەنم دە میسقال، سکەنجەبین یەك ئیستیکان تێکەڵاو، وەختی نوستن لەدم و چاو بنرێ، بەیانی بەئاوی گەرم دم وچاو بشوا، بەوشێوەیە تا زیپکە لەناو نەچن٠ (٢) ڕونی گەنم دم و چاوی پی‌ چەوربکرێ، زیپکە سورەکانی سوتێنەر، پنك و دنکەکانی ڤاوەیی پێست لائەبا٠ (٣) چەور کردنی دم و چاو بەزنیانی کوتراوو لێك دراو بەڕون (٤) پیازی نێرگزی کوتراوو تێکەڵاو بەسرکە، دم و چاووگەردەن و سینگی پی‌ چەور بکری‌ تاپینەکانی سورو سپی پاك ئەکاتەوە٠ (٥) نوشادر بکوترێو بەئاوی لیمۆی ترش لێك بدرێو دم و چاوی پێ چەوربکری‌ تا زیپکە لائە با (٦) پێنج میسقال ڕەشکەی کوتراوو تێکەڵاو بەسرکە لەزیپکەو پینە بندرێ٠ (٧) چەقەلەی تاڵ ئاردی نۆك، ئاردی باقلا، گوڵی هێرۆ، هەموویان هاوسەنگ کوتراوو تێکەڵاو بە ئاولیمۆ یا سرکەو گولاو زیپکەو پینەی پێ‌چەور بکرێن٠ (٨) گوڵنار، سماق، توێلکی هەنار، مردارسەنگ، هەموویان هاوکێش کوتراوو تێکەڵاو بەئاولیمۆ زیپکەو پینەی پێ چەور بکرێن٠ (٩) ئاردی نۆك، ئاردی باقلا، ئاردی جۆ، تۆوی گندۆرە، تۆوی ئارویێ، هەر یەك دە میسقال هەموویان جوان بکوترێن و کەپەکیان لی‌ بگیرێو هەرشەو کاتی نوستن نیو کەوچك لەچوار کەوچك شی ربکرێو لێك بدرێن و زیپکەو پینەکانی پێ‌چەور بکرێن٠ (١٠) ئاردی نۆك دە ستە نەرمە بکرێو لەسەرخاڵ و پنك و پینەی دم و چاو دابندری‌(١١) دم و چاو داگرتن بەسەر هەڵمی ئاوی کولاوی گوڵە حاجیلەدا زیپکە لائەبا. (١٢) مەڵحەمی دروستکراو بەنارویێو هەنگوین و کەمێك مێو

لەزیپکە بدرێ• (١٣) مۆز، سپی بکرێ و بەئاو، وتۆوی گندۆرە تێکەڵاو بکرێو لە، زیپکەو پەڵەی ڕەش هەڵبسوێ (١٤) ئاوی پیاز ئاوی ئاروی، هەریەك یەك کەوچك بەکەمێ ڕاوی هەنگوین تێکەڵاو، نەخۆشیەکانی، پێ چەور بکرێ، دوای سێ، یا چوار کاتژمێربەئاوی گەرم جێیەکان بشۆرێ• (١٥) موسیر یا سیر بەنوشادربکوترێن و لەپینەکانی سپیو قاوەیی بندرێن• (١٦) ئاوی پیاز لەك و پینەکانی دم و چاوی پێ چەور بکرێ• (١٧) خۆشاوی ترێ بەخوێ لێك بدرێو شوێنەکانی پێ چەور بکرێ• (١٨) نۆك بکوڵێو هەویربکرێ و لەزیپکە بندرێ (١٩) ڕۆژانە خواردنی ماست• (٢٠) بۆدرەی چەقەلە تاڵ لەدم و چاو بدرێ• (٢١) ڕۆژانە چەند جار چەور کردنی دم و چاو بەڕونی چەقە لە تاڵ (٢٢) ڕۆژانە گیای گوڵە حاجیلە یا بەیبونە بکوڵێو سەری بەسەردا بگیرێو هەڵمەکەی بۆدم و چاو و زیپکەکان بێ تا ئارەقە ئەکا (٢٣) ئاولیمۆ بەخوێ لێك بدرێو جێ یەکانی پێ چەور بکرێ. (٢٤) ئاوی لیمۆ تێکەڵ بەقوڵەنیا جێیەکانی، پێ چەور بکرێ. (٢٥) خواردنی ترێی فەرەنگی. (٢٦) نورەو خەنە لێك بدرێن و زیپکەی پێ چەور بکرێن. (٢٧) گۆشتی ڕەشە وولاخ و چەوەندەر تێکەڵ بکوڵێن و بخورێن (٢٨) خواردنی ماش پنك و پینەی سپی لەناو ئەبا• (٢٩) جاترەو زیرەی ڕەش بکوترێن و بەڕونی زەیتون لێك بدرێن و نەخۆشی‌یەکانی پێ چەور بکرێن•

**باسی نەخۆشییەکانی لێووزاروزمان وددان وپدووەکان وچارەیان ئەکات:**

**أ- بۆتامیسکە، وقەڵشینی لێو، چارەی بەچەند هۆیەکە:**

(١)شوتنی زارو لێو بەئاوی کەرەوز٠ (٢) بەگوڵیو منەوشە، فلوس، ئاوی گژنیز، نسپرزە بەریکاج، هەریەك تەنها یا هەموویان پێکەوە٠ (٣) ڕۆژانە خواردنەوەی ئاولیمۆی تازە لەخورێنیو کاتی نوستن٠ (٤) خواردنی پەتاتە لێو پتەوو توند ئەکا٠(٥) ئاوی داری مێو لەتامیسکە بدرێ. (٦) ئاوی کولاوی باینجان بەرونی کتان لێکدراو قەڵشی لێوی پێ چەور بکری٠ (٧) خواردنی شتی سارد، سروشت (٨) بەزی بزنێ، گەرم بکرێولێوی پێ چەور بکرێ (٩) سەت تاسەت و پەنجا گرام بیەدانە، لەلیترێك ئاودا بکولێ ڕۆژانە چەند جار شوێنی قەڵشیوی پێ چەوربکرێ (١٠) خواردنی زرشك. (١١) ئاوی هەنار. (١٢) ئاوی عیناب. (١٣) کاهو. (١٤) پەلکی چەوەندەر. (١٥) شۆربای جۆ. (١٦) شۆربای نیسك٠ (١٧) شۆربای گژنیزو چەوەندەر٠ (١٨) سەوزییەکان٠

(١٩) بادام زەمینی (٢٠) شیر٠ (٢١) هێلکە٠ (٢٢) هەرچی فیتامین (ب) ی تێدابی، خواردنی بۆ نەخۆشیەکانی لێو باشە٠

## ب- بۆزیپکەوپەنکە، وئێش وکولی ناوزاروزمان:

(١)دووسەت و پەنجا گرام پەلکی کەرەوز لەناو یەك لیتر ئاودا بکولێو چەندین جار غەرغەرەی پێ بکرێ (٢) سی گرام پەلك و گوڵی هێرۆ لە یەك لیتر ئاودا بکولێو چەند جار غەرغەرەی پێ بکرێ (٣) چل گرام پەلکی ووشکی گوڵی مریەم لەیەك لیترئاودا بۆ ماوەی دەخولەك بکولێو جاچەندین جار غەرغەرەی پێ بکرێ (٤) دووسەت گرام ڕەگی مێکوك لەیەك لیتر ئاودا بکولێ، تا سێبەشی ئاوەکە نەکولێو بەشێك نەمینی، چەندین جار بەو ئاوە، غەرغەرە بکرێ (٥) جاترە بکولێو غەرغەرە بەئاوەکەی بکرێ (٦) خارخسك بکوترێو بەڕاوی هەنگوین لێك بدرێو بخورێتەوەو غەرغەرەی پێ بکرێ. (٧) ڕۆژانە، سێ کات خواردنەوەی دەم کراوی گوڵیزمانەگا، وسومبول تیب پێکەوە یا زمانەگا بەتەنها٠ (٨) جوینی بەیبون و مازوو٠ (٩) غەرغەرە بەئاوی بەری کاج. (١٠) غەرغەرە بەئاوی کەرەو زوئسپرزە. (١١) شوتنی زار بەئاوی کەرەوز گوڵی ومنەوشە، فلوس، ئاوی گژنیژ، ئسپرزە، بەریکاج، هەموویان تێکەڵاو یا بەتەنها٠ (١٢) خواردنی دارچین٠ (١٣) ڕەگی ڕوکێش بکوترێو بەڕاوی

هەنگوین لێك بدرێو غەرغەرەی پێ بکرێو بخورێتەوە. (١٤) ڕۆژانە جوینیپون. (١٥) خواردنی پەتاتە، زار پتەوو توند ئەکا (١٦) ڕۆژانە غەرغەرە کردن و لەزاروەردانی ئاو یادۆشاو یا شەربەتی پەسیرە. (١٧ ) گوڵناری کوتراوو تێکەڵاو بەسرکە غەرغەرەی پێ بکرێ ناوزار بەهێز ئەکا. (١٨) خواردن و جوینی ڕیحان. (١٩) شوتنی ناوزار بەپەلك و پشکوتەکانی بەیبونە. (٢٠) خۆپاراستن لەخواردنی خورما. (٢١) خواردن و جوینی تەرخون، برینەکانی ناوزار، سارێژ ئەکا (٢٢) چەور کردنی ناوزار یا، غەرغەرە کردن بەڕونی بەهێ نەخۆشیەکان لائەبا. (٢٣) غەرغەرە کردن بەئاوی کوڵاوی خەشخاشی ڕەش (٢٤) خواردنی ڕێواس و پەلك و بنك و ئاوەکەیان (٢٥) ڕۆژانە سێ کات خواردنەوەی دەم کراوی گوڵە حاجیلە یا بەیبونە. (٢٦) مێخەکی هاڕاوسمل، ڕەژوو، توێلکی هەنار گوڵنار هەموویان هاوکێش لێك بدرێن و بهێڕدرێن و ناوزار، و ددانی، پێ بشۆرێو غەرغەرە بکرێ دەرمانە بۆ هەموویان. (٢٧) غەرغەرە کردن بەئاوی گژنیژ یا ئاوی کوڵاوی ئەو (٢٨) سەت گرام سیرنیودەسکە کەرەوز نیو خۆراك چای دووپەرداخ ئاو، پەرداخێك شیر، هەموویان پێکەوە بکوڵێن و لێك بدرێن و بخورێن (٢٩) غەرغەرە کردن بەئاوی کوڵاوی سیر زارو ددان پاك ئەکاتەوە. (٣٠) خواردنەوەی ئاوی کوڵاوی چەوەندەر بۆ هەموو نەخۆشیەکانی ناوزارو ددان باشە. (٣١) جوینی گیای گوڵە حاجیلە،

وبەیبون• (٣٢) ڕاگرتن و غەرغەرەکردن بەدەمکراوی (الرمال الاصفر) بۆ ئێش و نەخۆشیەکانی ناو زار• (٣٣) غەرغەرە کردن بەئاوی دەمکراوی زوفای ووشك بۆ ئێش و نەخۆشیەکانی ناوزار (٣٤ ) غەرغەرە کردن و ڕاگرتنی دەمکراوی سێ یەمی توێلکی داربەڕوو یادەمکراوی پەلکی ئەو، جا فرێ بدری خوێنی زارچارە ئەکا. (٣٥) غەرغەرە کردن بە، میوەی یا دەمکراوی گوڵی ئیجاصی شائیك بۆ ئێش و نەخۆشیەکانی ناو زار. (٣٦) غەرغەرە کردن بەئاوی دەمکراوی گوڵی بنەوشە چەند جار شێر پەنجەی زمان لەناو ئەبا•

## ج- بۆکەم کردنەوەیئاویناوزار،چارەیبەچەندهۆیەکە:

(١) شوتنی زارو ددان بەمشکی کەلەمی سوتاو ووشك کەرەوەیە• (٢) خواردنی زنیان ووشك کەرەوەیە (٣) ئاوی بێ ئاوی پەسیرە، یا ئاوی هەنار بەزۆری بخواتەوە• (٤) پەلکی تاڵیشك کوترا لەگەڵ خوێ ڕۆژانە بخورێ• (٥) سماق، نیسك، گوڵنار پەلکی تووی سپی، هەر یەك لەوان غەرغەرەی پێ بکرێ یا هەموویان کوتراوو تێکەڵاو غەرغەرەیان پێ بکرێ. (٦) نەبات چل میسقال زەنجەفیل، دارفلفل ، زیرەی خوساو لەناو سرکە هەریەك پێنج میسقال هەموویان کوتراو تێکەڵاو، ڕۆژانە، بەئەندازەی، یەك کەوچك بخورێن، ئاوی ناوزار کە بەهۆی ساردی بیکەم ئەکاتەوە•

**د- بۆزۆرکردنیئاویناوزار،چارەیبەچەندھۆیەکە:**

(١) خواردنەوەی ئاولیمۆی تازە لەخورێنیو کاتی نوستن (٢) خواردنە وەی ئاوی کولاوی پەلکی ووشك کراوەی درەختی قەیسی ووشکی ناوزار لائەبا٠ (٣) خواردنی تەرخون

**ھ- بۆلابردنیبۆنیناخۆشیزاروھەناسە،چارەیبەچەندھۆیەکە:**

(١) زۆر ڕاگرتنی ھەلیلەی ڕەش لەناوزار٠ (٢) گوڵنار بکوترێو بەسرکە تێکەڵاو بکرێو غەرغەرەی پێبکرێ (٣) توێلکی ھەنارو گوڵنارو مازوو، زاجیسەوز عاقرقرھا سماق ھاوسەنگ پێنج یەکی ھەموان خوێ کوتراوو تێکەڵاو بەسرکە ڕۆژانە غەرغەرەی پێبکرێ. (٤) لەزار، وەرکردن و غەرغەرە کردن بەسرکە، وگولاوی، تێکەڵاو. (٥ ) خواردنی قەیسی٠ (٦) خواردنی تەرخون بۆنی زارو گەروخۆش ئەکا (٧) خواردنی بەھێو بەرھەمەکانی٠ (٨) خواردنی ھەرجۆرە سیرێك٠ (٩) ڕۆژانە خواردنی پیاز٠ (١٠) خواردنی جەعفەری٠ (١١) بۆماوەی پازدە خولەك جەعفەری بجوێوجاتلێپەکە فرێبدات ویەك سێو بخوات بەڵام بەباشی بیجویو قوتی بدا٠ (١٢) خواردنی نۆکی لەئاو داخوساو بەکاڵی بۆنی سیر لائەبا٠ (١٣) خواردنی پونگ یاخواردنەوەی ئاویدەم کراوی٠ (١٤) خواردنی کەرەوز، بۆنی ھەناسەو

سیر لانەبا٠ (١٥) خواردنی کوزەڵە، چێژی زار خۆش ئەکا. (١٦) خواردنـی کاهـو، تایبەت لەدوای خواردنی، سیر و پیاز بۆنە کەیان ئەبڕی (١٧) خواردنی ڕیحانە بەنان، لەدوای خواردنی سیرو شتیوا بۆنـەکەی لا ئەبا٠ (١٨) ڕۆژانە خواردنەوەی دەم کراوی گوڵە حاجیلە٠

## و- بۆزمان گرانیولاڵی،چارەیبەچەندهۆیەکە:

(١)کونـدورو مێوژوجاترە پێکەوە بکوترێن وڕۆژانە لێی بخورێ (٢) دەرمانەکانی ژمارە (١،٢،٣) یپیتی (ز)٠

## ز-بۆبونەوەیزمانیمنداڵ وفێربوونیقسەکردنیان،چارەیبەچەند هۆیەکە:

(١)عاقرقرِ های کوتراو بەنەباتی کوتراو یاشەکر تێکەڵاو بخوا٠ (٢ ) تۆوی پڵپێنەو- گژنیژو زمانە کوێشکە تێکەڵاو وڕۆژانە بخواتەوە٠ یائەوانەی گوتمان لەگەڵ نیو کیلۆ مێوژ، بکوترێ، وڕۆژانە سێ، جار هەر جاربەئەندازەی، فندەقێك بخوا٠ (٣) عاقرقرِ هاوتۆوی، گژنیژو تۆوی پڵپێنە، وزمانە چوێشکە، هاوکێش و کوتراو بە پەرداخێك ڕاوی هەنگوین ونیوکیلۆ مێوژ لێك بدرێن و بەیانیو ئێوارە هەرجار بەئەندازەی فندەقێك بخوا٠ (٤) عاقرقرِ هابکوترێ یەك کەوچکی

چای لەبن زمانی منداڵ دا بندرێ تابەتەواوی ئەتوێتەوەو ئاوەکەی قوبدا جاخڵتەکە فرێبدا بەو شێوەیە چەند جار تافێرە قسەئەبی٠ ( ٥) کشپِل و پێستی مامزپێکەوە بسوتێن و بهاڕدرێن و بەخواردنی منداڵ لێك بدرێو پێی بدرێ بۆ ماوەیەك٠

ح- بۆبەهێزبوون وهەموونەخۆشی‌یەکانی‌ددان چارەیان بەچەند هۆیەکە:

(١)غەرغەرە کردن بەئاوی مارچوبەئێشی ددان لائەبا (٢) زۆر ڕاگرتنی هەلیلەی

ڕەش لەناو زار، ددان بەهێز ئەکا٠ (٣) ئاوی پیاز بە لۆکە لەسەر ددانی بەئێش و کلۆر دابنرێ، ئێشەکەی لائەبا٠ (٤) خواردنی پرتەقاڵ بەرگری لەکرمێ بوونی ددان ئەکا٠ (٥) غەرغەرە کردن بەئاوی کوڵاوی توو بۆ کرمێ بوونی ددان. (٦) شوتنی ناوزارو غەرغەرە کردن بەئاوی کوڵاوی جاترە بۆئێشی ددان٠ (٧) غەرغەرە کردن بەئاوی کوڵاوی پەلك و ڕەگی چەق چەقە (٨) ڕونی نۆك لەددانی ئێشاو بندرێ (٩) غەرغەرە کردن بەئاوی خۆشاوی فەریکەنۆك بۆئێشی ددان. (١٠) خواردنی پەنیر بەرگری لەدا خورانی ددان ئەکا. (١١) جوین و خواردنی

توور، بەرگری لەددان کەوتن ئەکا (١٢) ئاوی کولاویتەرخون غەرغەرەی پێبکرێ، ئێشی ددان لائەبا٠ (١٣) جوینی بنێشتی بێشەکر ددان بەهێز ئەکا٠ (١٤) خواردنەوەی چا ددان وپوك ئەپارێزی (١٥) جوینی دنکی، بەهێ چاڵی ددانەکان پڕ ئەکاتەوەو ڕێکیان ئەخا. (١٦) بیبەری، ڕەش لەددانی خوراوو کرمێ بنرێ چارەی ئەکا٠ (١٧) غەرغەرە کردن بەئاوی کولاوی ڕەشکە، پدو وددان توند ئەکاو ئێش وئازار لائەبا (١٨) ڕاگرتن وغەرغەرە کردن بەئاوی کولاویڕەگی گوڵەبەڕۆژە، ناوزارو ددان بەهێزو توند ئەکا٠ (١٩) غەرغەرە کردن بەئاوی کولاوی زەردەچەوە، نەخۆشییەکانی ناوزارو ددان لائەباو بەهێزیان ئەکا. (٢٠) جوینی سێوەبن عارد یا غەرغەرە کردن بەئاوی کولاوی ددان و ناو زار بەهێز ئەکا ونەخۆشییەکان لائەبا٠ (٢١) سەت گرام سیر، نیود ەسك کەرەوز لەدوو پەرداخ ئاو، ویەك پەرداخ شیردا، نیو خۆراك چای، تی ێبکرێ وبکوڵێ، جابخورێتەوەو غەرغەرەشی پێ بکرێ بۆ هەموو نەخۆشییەکانی ناو زارو ددان باش٠(٢٢) کەڵەشاخ گرتن (٢٣)

جاترەی بێستانیو زیرەو سرکە لێك بدرێوغەرغەرە بکرێ• ( ٢٤) بیبەری هاڕدراو لەددانی کرمێو بەنێش بکرێ چارەی ئەکا• (٢٥ ) لەجێگای ددانی کێشراو حەسەن لەبە بنرێ خوێن قەپات ئەکا• ( ٢٦) دەرمانەکانی ژمارە (٢٦،٢٩،٣٠) یپیتی (ب). (٢٧) ڕاگرتن و غەرغەرە کردن بەئاوی دەم کراوی گوڵی "اکلیل بوقیعی" ئێشی ددانێك بەهۆی ڕۆماتیزم و کلۆر بوون و ڕزین پەیدابووبی لەناوی ئەبا. (٢٨) غەرغەرە کردن و ڕاگرتنی، دەمکراوی، زوفای ووشك لە، زاردا ددان لەهەر نەخۆشییەك ئەپارێزێ• (٢٩) غەرغەرە کردن بەشیری حوشتر ددانیکرمێ چارە ئەکا (٣٠) هەڵگرتنی ددانی ڕێوی ئێشی ددان لائەبا بەڵام لایڕاست بۆڕاست لای چەپ بۆ چەپە• (٣١) ددانی کەروێشك سەربۆ لای سەرخوار بۆلای خوار ڕاست بۆ لای ڕاست چەپ بۆلای چەپ، لەسەر ددانی کرمێ، دابندرێ چاکی ئەکاو، ئەی هێنێتەوە. (٣٢) کەسێ ددانی کەروێشك بەخۆیەوە هەڵبگری، ئێشی ددانی نامینی• (٣٣) ددانی کەمتیار لەباسکی خۆی قەیم کا، ژانی ددانی نامینی• (٣٤) کورکی، گاجۆت بسوتێو مشکییەکەی بەناولێك بدرێو غەرغەرەی پێ بکرێ ئێشی ددانەکەی نامینی• (٣٥)مشکی سوتاوی قۆچی گەوەزن لەددانی کرمێو بەئازار بندرێ، چاکی ئەکاتەوزە•

**گ- بۆبەهێزبوون و هە موونە خۆشی یە کانی پدوو بنی‌ددان، چارەیان بە چەندهۆیەکە:**

(١)بەئاردی خەرتەل و عاقرقرها تێکەلاو ناوزاربشۆرێ. (٢) بەزی گوزارك، مازوو گولنار، بەڕوو، مستەکی، تەباشیر، خوێ هەموویان کوتراوو بەمرەبای هەنار تێکەلاو زاری پێ بشۆرێ. (٣) توێلکی هەنار، گولنار، سماق، مازوو، خوێ، هەموویان کوتراوو تێکەلاو بەئاوی گژنیژو سرکە زاری پی بشۆرێ. (٤) ڕونی نۆك لەپوکی ئاوساو بندرێ. (٥) غەرغەرە کردن بەئاوی خۆشاوی فەریکەنۆك بۆ ئاوسانی پدو (٦) دۆشاوی پلپینە لەپدوان بندرێ، وەرەم وخوێنی پدوچاك ئەکا. (٧) جوینی گولەسور بەتایبەت خونچەی تازە پشکوتوو پدوو ناوزار پتەوو ساغ ئەکا (٨) زۆر ڕاگرتنی هەلیلەی ڕەش لەناو زار. (٩) گولنار بکوترێو بەسرکە تێکەلاو بکرێو غەرغەرەی پێ بکرێ پدوو ناوزاربەهێز ئەکا. (١٠) خواردنی پەتاتە. (١١) غەرغەرە کردن بەئاوی گەلای توو (١٢) جوینی کاکلی چەقەلە. (١٣) ئاوی فەریکەچەقەلەی تەڕو تازە پدو بەهێزئەکا. (١٤) مشکی توێلکی ڕەقی چەقەلەی سوتاو لەپدو هەلبسوێ (١٥) خواردنی قەیسی ڕووپۆشی ناوزار بەهێز ئەکا. (١٦) خواردنی قەیسی بەرگری لەخوێن هاتنی پوك ئەکا. (١٧) خواردنەوەی ئاوی کولاوی پەلکی چەوەندەر یا غەرغەرە کردن بەئاوەکەی بۆ هەموو نەخۆشیەکانی ناو براوی زار

باشە. (١٨) شوتنی پدوو ددان بەسۆتکە پدو بەهێز ئەکا (١٩) خواردنی گێزەر، پوك بەهێزو توند ئەکا. (٢٠) خواردنی سێوە، بن عارد. (٢١) غەرغەرە کردن بەئاوی پەسیرە بۆ پدو باشە (٢٢) جوینی پەلکی درەختی زرشك پدوو ددان بەهێزو خوێنی پدو ئەبەستی. (٢٣) غەرغەرە کردن بەئاوی کولاوی هەنجیر وەرەمی پدولائەبا. (٢٤) سی تا چل گرام مریەم گولی لە لیترێك ئاو بۆ ماوەی دە خولەك بکولێ، ئاو زاری پێ بشۆرێ، برین و وەرەم و زیپکەو نەخۆشییەکانی ئاو زارو پدو لائەبا (٢٥) خواردنەوەی ئاوی گوشراوی تەرەتولە لەبەهاردا بۆپاك کردنەوە و لابردنی خوێنی پدو باشە. (٢٦) توێلکی سەوزی گوێزلەسیبەر ووشك بکرێتەوە و بهاڕدرێ، ڕۆژانە لەپدوان هەڵبسوێ. (٢٧) ئاوی گوێزی تازە هەنگوین، مرەبای ترێ، لێك بدرێن و لەزارو پدوو بنی ددانان هەڵسوێ. (٢٨) ئەریسای زەرد بهێڕدرێو بە ئەنگوست یاسیواك لەپدو، وبنیددان هەڵبسوێ. (٢٩) ڕۆژانە چەند جار بەئاوی پرتەقاڵ غەرغەرە بکرێ، وەرەم وچرکی پدوو بنیددان لائەبا. (٣٠) گولی ئەرمەنی بەنەرمیو وردبکرێو بەڕژووی دارە مێو لێك بدرێو لەپدو هەڵبسوێ بەهێزی ئەکا. (٣١) یەك گرام گیای، ئیسفەند، لە یەك فنجان ئاوی کولاو بکرێو لەدوای، چەند خولەك غەرغەرەی پێبکرێ، هەوکردنی پدولائەبا. (٣٢) دوو تاسێ گرام زوفای ووشکلە فنجانێك ئاوی کولاوبکرێ، پاشی چەند خولەك

غەرغەرەی پێ بکرێ٠ (٣٣) جوینی پەلکی ئۆکالیپتۆس، یاغەرغەرە بەدەم کراوی ئاوەکەی، نەخۆشی‌یە کانی پدو لائەبا٠ (٣٤) بیست تا پەنجا گرام گوڵ یا پەلکی درو لە لیترێك ئاودا بکوڵێ، ئاوزار وپدوی پێ بشۆرێن ئاوسانی لائەبا (٣٥) پەنجا گرام بنەوشۆکە لە لیترێك ئاوی سارد دابکوڵێو بۆ ماوەی‌پازدەخولەك دەم بکێشی‌ورۆژانەدووجارناوزاری‌پێ‌بشۆرێ و غەرغەرەی پێ بکرێ، نەخۆشی‌یەکانی پدولائەبا. (٣٦) بیست گرام پەلك یا گوڵی تۆلکە لەنیو لیترئاوی سارد نیوکات ژمێر بخوسێندرێ، جالەسەرئاگردا بندرێ تائە کوڵێ بۆ ماوەی بیست خولەك دەم بکێشێ بەشیلتێنی ئاوزاری پێ بشۆرێو غەرغەرە ی پێ بکرێ پدوان بەهێز ئەکاوخوێنیان ئەبەستێ٠ (٣٧) هەموو بەیانی‌و ئێوارە یەك ئاوزارو ددان بشۆرێن و بەئەنگوست ڕونی زەیتون لەپدوان هەڵبسوێ پدوی لاواز قەڵەوو بەهێز ئەکا٠ (٣٨) گۆشتی نارنج لەئاوزاردا ڕابگیرێ، پدو بەهێز ئەکا٠ (٣٩) جوین و لەئاوزار ڕاگرتن و غەرغەرە کردن بەشاتەرە، پدو بەهێز ئەکا٠ (٤٠) چەند دنکە مێخەك لەناو ئاولیمۆ بندرێ، دوایی بەتینی‌سۆبا ووشك بکرێتەوە وجابهاڕدرێ، لەددان و پدو هەڵبسوێ پدو بەهێز ئەکا. (٤١) جوینی گوڵی هەنار باشە. (٤٢) غەرغەرە کردن بەئاوی ترێ. (٤٣) زاخ بکوترێو بەسرکە لێك بدرێو لەپدو و بنی ددان هەڵبسوێ بۆهەمو نەخۆشی‌یەکانی پدوو

بنی ددان باشە جێگری زاخ خوێیە. (٤٥) قۆچی گا جوان بشۆرێ‌و ووشك بکرێتەوەو بەکارتیخ ورِەندە جوان وورد بکرێ، تۆزەکەی بەبنی ددان وەربکرێ، خوێنی پدو نەبەستێ٠ (٤٦) شێست گرام توێلکی درەختی بەڕوو ووشك بکرێ‌و بکوترێ‌و لەلیترێك ئاوی سارد بکرێ و دوازدە خولەك بکوڵێ‌و جادابپۆشرێ تاسارد ئەبیتەوە، پاك بکرێتەوەو بە ئاوەکەی ڕۆژێ سێ جار ناوزار بشۆرێ٠ (٤٧) گوڵاو شیلتێن بکرێ‌و لەپدوو بنی ددان بدرێ یا غەرغەرەی پێ بکرێ٠ (٤٨) ناردو ڕاوی هەنگوین وەك یەك وکەمێك ڕون و ئاو لێك بدرێن و لەپدوان هەڵبسوێن، بۆ پدوو ناو زار باشە٠ (٤٩) سکەنجەبین وخوێ لێك بدرێ‌و لەزاری بگیرێ‌و غەرغەرەی پێ بکرێ، خوێنی پدو نەبەستێ٠ (٥٠) توێلکی هەنار بکوڵێ‌و ئاوەکەی لەزاری بگیرێ‌و غەرغەرەی پێ بکرێ، خوێنی پدو نەبەستێ‌و پدو بەهێز ئەکا٠ (٥١) مێکوك پارەگی بکوڵێ‌و لەزاری بگیرێ‌و غەرغەرەی پێ بکرێ خوێنی پدو نەبەستێ٠ (٥٢) خواردنی گوڵنار پدوو ناوزار بەهێز ئەکا٠ (٥٣) پونگ بسوتێ‌و بەمشکی‌یەکەی پدوو ددان سیواك بکرێن بەهێزیان ئەکا٠ (٥٤) جوینی گوڵی مێخەك یا بەووردکراوی بەپدوو ددانان وەربکرێ، بەهێزیان ئەکا، زۆر ترینی ئەو دەرمانانە بۆئێشی ددان و ناوزاریش بەسودن. (٥٤) غەرغەرە کردن و ڕاگرتنی دەمکراوی

سێیەمی توێلکی داربەڕو یا، دەمکراوی پەلکی ئەو لەپاشان فڕێ بدرێ خوێنی پدو چارە ئەکا٠

## ی- بۆسپی کردنەوەی ددانی زەردبوو،چارەی بەچەندهۆیەکە:

(١)شوتنی ددان بەمشکی پەلکی کەلەمی سوتاو٠ (٢) گوڵنار، سماق، مازوو، هەموویان هاوکێش نیوکێشی یەك لەوان خوێ هەموویان لێك بدرێن و زارو ددانیان پێ بشۆرێ باشترین دەرمانی شوتنی ناوزارو ددانە٠ (٣) مشکی توێلکی ڕەقی سوتاوی چەقەلە لەددان هەڵبسوێ٠ (٣) چەند، دنکە مێخەك لەناو ئاو لیمۆ بندرێن، دوایی بەتینی سۆبا وشك بکرێنەوەو بهاڕدرێو لەددان وپدو هەڵبسوێ٠ (٤) قاپی گا بسوتێ و مشکی‌یەکەی لەددان هەڵبسوێ پاك و سپی‌یان ئەکاتەوە. (٥) جەرگی بەران بە تەڕی بسوتێو مشکی‌یەکەی لەددان هەڵبسوێ٠

**باسی بەهێزبوونی پێنج هەستەکان وگیانیزیندووئەندامە سەرەکییەکان وهەمووئەندامەکانی بەدەن ولەناوبردنی ماندی بوون وتەمبەڵیئەکا:**

**أ- بۆبەهێزبوونیپێنج هەستەکان:**

(١)ڕۆژانە خواردنی پێستی هەلیلەی زەرد. (٢) خواردنەوەی ئاوی پرتەقاڵ. (٣) خواردنی بەهەیی گەیوو.

**ب- بۆبەهێزبوونیگیانیزیندوو:**

(١)بادام یابندەق جوان بکوترێو بەخورما لێك بدرێو بخورێ. (٢) خواردنی زەعفەران ووزە هێنەرە. (٣) نارنج. (٤) ئوستوخدوس. (٥) کوندور.(٦) لۆبیای سەوز (٧) ماست. (٨) کاکڵی چەقەلەی شیرن. (٩) خورماوڕون. (١٠) شویت یا تۆوەکەی تایبەت بەگۆشتی ماسی. (١١) قەیسی. (١٢) بەهەیی گەیوو. (١٣) گیای چاو کتکە. (١٤) خەرتەلە، وتۆوەکەی، بەشێوەی گونجاو. (١٥) چیالیك. (١٦) مۆز. (١٧) کزن.

١٨) گیای کەڵەوی. (١٩) کاشمە. (٢٠) گندۆرە. (٢١) ڕۆژانە خواردنەوەی، دەم کراوی، جاترە، یا خواردنی بەشێوەی گونجاو (٢٢) دلۆپ دلۆپ لەکەپو کردنی ئاوی ئاروێ٠ (٢٣) زۆربۆن کردنی نێرگز٠ (٢٤) گۆشت خواردن٠ (٢٥) بۆن کردنی بۆنەکانی خۆش٠ (٢٦) زوو زوو خۆشوتن٠ (٢٧) کەتان دەبەر کردن٠

## ج- بۆبەهێزبوونیئەندامەسەرەکیەکان و هە موونە ندامە کانی بە مێ:

﴿ئەندامە سەرەکی‌یەکان بریتین لە مێشك، دڵ، جەرگ، گورچیلەکان، کە مەرگە سات و زیانی مێشك بیرو بۆچونی زۆرو ناڕەوایەو مەرگەسات و زیانی دڵ ترس و وەحشەتە، وە مەرگەسات وزیانی جەرگ خواردنەوەی شتی سەرخۆش کەرە، وە مەرگەسات وزیانی میزدان جووت بوونی زۆرە﴾٠ (١) ڕۆژانە خواردنی ترێی شیرن و گەییو دوو کاتژمێر پێش و پاش هەرخواردنێك٠ (٢) مێوژ٠( ٣)نۆکی کولاو. (٤) خواردنەوەی شەربەتی ترێ (٥) خواردنی ئوستوخدوس (٦) هەلیلەی ڕەش ئەندامە -کانی ناو هەناو بەهێزئەکا ٠ (٧) پەنیر بەهێزکەرەو زیانی هەستانی خوێن و قەڵەو بونیشی

نىیەە· (٨) شبیت یا تۆوەكەی تایبەت بەگۆشتی ماسی· (٩) خورماوڕون· (١٠)قەیسی (١١) تەرخون (١٢) بەهێی گەیوو (١٣) خەرتەلە بەشێوەی گونجاو· (١٤) گیای چاوەپشیلە· (١٥) خواردنەوەی ئاوی پرتەقاڵ. (١٦) بادامی شیرن بكوترێ‌و بەڕاوی هەنگوین لێك بدرێ‌و بەیانیان لەخورێنی بخورێ. (١٧) خواردنەوەی دەم كراوی گوڵی زمانە گا بەهێزكەری ئەندامە سەرەكیە كانە. (١٨) ڕۆژانەی دەم كراوی جاترە دوای هەرخواردنیك، یاخواردنی جاترە بەشێوەی گونجاو. (١٩) زۆر بۆن كردنی نێرگز. (٢٠) ڕۆژانە خواردنی ڕاوی هەنگوین لەخورێنی بۆ ساردو تەڕسروشتان (٢١) خواردنی جۆی بۆدراو كوتراوبەشەكر بەهێزكەرە تایبەت بۆ منداڵان.

## د- بۆلەناوبردنیماندی بوون وتەمبەڵی،چارەیبەچەندهۆیەكە:

(١)خواردنەوەی ئاوی لیمۆی، تازە لەخورێنی، وكاتی نوستن. (٢) ڕۆژانە دەم كراوی جاترە دوای هەرخواردنێك یا خواردنی بەشێوەی گونجاو. (٣) مستێك پەلكی "اكليل الجبل" لەچوار پەرداخ نەبیژی سپی بكرێ‌و بۆماوەی دوو ڕۆژ دابپۆشرێ جا بپاڕزنێ‌و ڕۆژانە دوو پیاڵەی لێ بخورێتەوەبەدوو كات. (٤) كلك و قۆچی بزنەكێوی پێكەوە

بسوتێن و مشکی یەکەی بەرِون مەڵحەم بکرێ لەبەرەپێیان بدرێو پێ بهەنوێ، ئەوکەسە هەردەم ماندی نابی. (٥) ڕۆژانە خواردنەوەی دەمکراوی گوڵە حاجیلە یا بەیبونە بەسێ کات.

واخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين وصلىَ الله علىسيًّدِنا[محمَّدٍ] واله الطّاهرين

كۆتايىوتەواركەرى بەرگىيەكەم بەچەند فەرمودەىپێغەمبەر وتێبينىوبەسەرهات وڕاسپاردەيەكىپزيشك وپسپۆرانى لێهاتوو :-

(١) پارێز لەچارەو خواردنى دەرمان باشترە٠

(٢) باشترين خواردن ئەوەيە كەزۆر ئارەزووت لێبيى وبرسى بىو گەدەت چۆل بى،

(٣) لەپێش ئەوەى تێرببى لەهەرخواردنێك دەست هەڵ بگرىو واز بێنى.

(٤) تا بەخواردن و خواردنەوەى ڕۆژانە چارەى نەخۆشى بكرێ لەدواى پارێز دەرمان نەخۆى٠

(٥) تا بەتاكە دەرمانێك چارە بكرێ دەرمانى تێكەلاْو، دوو يا زۆر تر بەكار نەهێنيت، وەهەربەو شێوە تا بەدوو دەرمان چارە بكرێ نەكرێ بەسێ و چوار تا كۆتايى.

(٦) زیادو کەمی لەکێشی دەرمان دا دروست نی‌یە زیاد زیان دێنیت و کەم بێ هێزە و ئیش ناکات هەروها خۆراکی ڕۆژانە زیادو کەم نەکرێ مەگەربەئاماژەی پزیشك•

(٧) ئەمین ڕووەیحە لەپەرتوکی [التداویبالاعشاب] دا ئەگێریتەوە ئەڵێ لە سالسبۆری پایتەختی ڕۆدیسیا لەبەندیخانەی ئینگلیزەکاندا بووم لەگەڵ هیندێکی زنجی‌یە ڕەشەکان لە کێلگەیەکدا بووین سەگێکمان دی بەگورگەلۆقە، دەڕوا گژو گیا یەکان بۆن ئەکا تا گەیشتە گیایەك دەستی کرد بەخواردنی میوەی گیایەکەی کە میوەیەکی زەردی خڕی گرتبوو چەند دانەیەکی لەمیوەی ئەوگیایەی خواردو بە گورجی لە ناو کێلگەکە دەر چوو منیش گەلێك لەم کارە سەرم سوڕما چونکە وەك دەزانی سەگ گیاخۆر نی‌یە بۆیە لەبەری گیاکەم هەلگرت و بردمە لای بەرپێوە بەری کێلگەکەو لێم پرسی ئەمەچی‌یە ؟لەوەلامدا گوتی ئەمە جۆرە ژەهرێکە بۆ زگ چون بەکار دێت !ئەو جا بۆم ڕۆن بۆوە کە پەروەردە کەرو بەڕێوە بەر زیرەکی یەکی وای داوە بەو ئاژەڵە کەبتوانی ئەم گیایە بناسی‌و سودو چارەی خۆی لێ وەربگری بۆ مەبە - ستی ڕەوان بوون وزگ چواندن لە کاتی ووشك وتوندی گەدەو هەناودا. (٨ ) هەروها، ناو براو لە هەمان سەرچاوە، دائەگێریتەوە ، بەوەرگرتن لەچەند، **سەرچاوەیەکداوئەڵێ:** خاتون (مرکیزەفرانسیسکا) ژنی

(مەرکیزکینکۆن) ی جێگریپاشاو فەرمانڕەوای وولاتی پیرۆ لەئەمەریکای باشوور دا نیشتوی (لیمای) پایتەخت بوون توشی نەخۆشی مەلاریا بوبو لەسەر پشت کەو تبوو تووشی تایەکی توند بوبو مەترسی مردنی لێ دەکرا ڕۆژێ لەڕۆژان سەرجەم پزیشکەکانی پاشا کۆبوبونەوە بۆ چارە سەری خاتون ئەوەی تەماشای دم و چاوی پزیشکەکانی کردبایە هەستی بەبێ ئومێدی، پزیشکەکان دەکرد، ومردنی مەرکیزەی، چاوەڕوان دەکرد، وەپزیشکی تایبەتی نەخۆشەکە داوای مێردەکەی کردو بەڕاشکاوی پێی گووت: ئێمە لەئاست مردن دا هیچ دەستەلاتمان نییە خاتون مەرکیزە لەسێ ڕۆژ زیاتر ناژیت!.. مەرکیز گوتی من نامەوێت گوێم لەووتەی وابێ پزیشکەکە ووتی: گەورەم پێویستە لەسەرم پێت بڵێم من توانام بەسەر ئەونەخۆشیەدا ناشکێت و مەرکیزە هەرسێ ڕۆژێکی تر دەژی مەرکیزیش بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە لەنەخۆشخانە هاتە دەرێو ووتی: هەرچەندە بەزانستی خۆتان دەرکەوتوە کەلەسێ ڕۆژ زیاترناژی بەلام من لێی نائومێد نیم سواران بەهەمو وولاتدا بلاو دەکەمەوە بگەڕێن بەدوای کەسێکی وادا کەبتوانی بەسەر ئەم نەخۆشیەدا زاڵ ببیت واش هەواڵ بلاو بۆوە کەمرکیزە لەسەرەمەرگ دایەو خەڵکی شار بەپەرۆش بوون بۆیەو ڕێنمایی سوارەکانیان دەکرد کەپیاوێکی پیری هەزاری دونیا نەویست و پسپۆر بەنهێنیەکانی دەرمانی گژوگیا لەسەر کێوی (ئاندا) دەژیت،

سوارەکان دۆزیانەوەو چوونەلایو هەواڵی دەرمانە ڕوەکەکانیان لێ پرسیو لەگەڵ خۆیان بردە لای مرکیز، پێشەکی پێ یان ڕاگەیاند ئەگەر لەئیشەکەیدا سەرکەتوبێ پاشا پاداشتێکی بێئەندازەی دەداتێو تا ماوی بەخۆشی دەژی پیرەمێرد گووتی: ئەم شتانە من تەفرە نادەن من لەڕێی خوادا، دەرمان دروست دەکەم کاتێك دەست و پێوەندەکانی، کۆشك چاویان بەپیرە چڵکنەکە کەوت هەموو بزەگرتنیو گاڵتەیان بەوەهات کە لە توانای دابیت مرکیزە ڕزگاربکات بەڵام جێگری پاشا پێی گوتن: گاڵتەی پێ مەکەن من بەدوام دا ناردوە پیرەیان بردە لای مرکیزە ئەویش جانتا کەی کردەوەو تورەکەیەکی لێ دەر هێنا توێلکە داری تێدا بوو بە ناوی کولاّو شەربەتێکی لێ دروست کردو جەم لەدوای جەم دەرخواردی نەخۆشەکەی ئەدابە لاّم یەکەم جار نەخۆشەکە لەبەر تاڵی ڕووی خۆی گرژکردو بێدەنگ بوو مرکیزیش بەسەر پیاوە پیرەکە داقیژاندی و گوتی مراندت.!! پیرەش گوتی، پەلە مەکە ئومێدەوارم چاك ببیتەوە، وازی لێ بێنن تائێوارە بەئاگا نایێت، ئێوارەش جەمێکیکەی ئەدەمێ دەبینی دوای چەند هەفتەیەك مرکیزە چاك دەبیتەوەو تەندروستی لەجاران باشتر دەبیت ئەم دەرمانەم لە توێلکی هەندی دار دروست کردوە دوای چەندین تاقیکردنەوە وئەزموون کەلەوانەیە زاناو مرۆڤی زیرەکیش پێی پێ نەبات جالەوڕۆژەوە بە پیرەی ووت تۆ بزیشکیمنی ئەگەر

نەتەویٚ لەم سەراو کۆشکەدا دەت هێڵمەوەو بەرگی ئاوریشمت لەبەر دەکەم لەخۆشیو خەلاٚتت دابزرت دەکەم چونکە تۆزۆر پزیشك تری لەپزیشکی وولاٚتە کەمان، پیرەش ووتی: سوپاست دەکەم گەورەم تۆ زۆربەئەمەك وسەخیت بەلاٚم تکام وایە ریٚگەم بدەی بچمەوە سەر کیٚوەکەی خۆم بۆئەوەی زیاتر شارەزایی پەیدا بکەم لەسوودی گوژوگیاو درەختەکانیەوە، خوا نەخواستە ئەگەر نەساغیەکتان هەبوو بنێرە بەدوام دائامادەم زوو بەزوو بگەمە سەریو چارەی بکەم مرکیزیش رێی پیٚ داپەیمانی ئەوەی لیٚوەرگرت لەکاتی پیٚویست دا بەهانایەوە بیٚت، جاپاش ماوەیەکی، کەم قسەی پیرەمێرد، هاتە جیٚو مرکیزە، چاك بۆوەو، موژدەی چاك بونەوەی مرکیزەیان بەوولاٚت ڕاگەیاندو لەپاداشتی ئەمەدا باجی ساڵێکی لەگە لەکەی نەستاندو بوو بەشایی ئاهەنگ، سوپاسی پیاوە پیرەکەیان کردو چاك بوونەوەی مرکیزە لەنەخۆشی مەلاریا لەبەرواری ساڵی/١٦٣٠ زاینی دا بوو کەسێك بیەوی شارەزای زیاتر لەم چیرۆکە بەدەست بیٚنیت با ئەماشای سەرچاوەی ناوبراو بکات٠ لاپەرە دە بەدواوە٠

وەدووبارە سوپاس و ستایشی بیٚ ژمارەو نە بڕاوە ئە کەم بۆ خوای گەورەی پیٚ دەری بەبەزەیی کەتوانای پیٚ دام بەرگی یەکەمی پزیشك و دەرمانخانەی سروشتی

تەواوو ئامادەی چاپی یەکەمی بکەم بەهاوکاری خوارزا بەرێزوخۆشەیستەکانم

ئازادو رابعەو خلیل• هەموو ئەو بەرێزانەی کەبەئەندازەی خۆیان یارمەتیان داوم ، وە ئومێدەوارم هەروها بەپشتیوانی خوا بەم زووانە بەرگی دووەمیش ئامادەی

چاپ ببی، ولەکوردستانی، خۆشەویستمان دا بلآو ببیتەوە، وسودی باشیان لیّ

وەربگیریّ کەئەم بەشانەی خوارەوە لەخۆ دەگری:

**بەشی دوازدە:** باسی نەخۆشیەکانی گەروو لەوزەتێن و ڕژینی خوارگەرو (تیرۆئید) وخەنازرو چارەیان ئەکات•

**بەشی سێزدە:** باسی چارەی هەمووجۆرە کۆخەیەك و بەڵغەم ئەك

**بەشیچواردە:** باسیدەنگ گیران و خۆش بوونی دەنگ و ئاواز، وچارەیان ئەکات•

**بەشیپازدە:** باسی بەرچیچکەو قرپ و باووشك، وچارەیان ئەکات

**بەشیشازدە:** باسی تەنگە نەفسیو هەناسە سواریو نەخۆشییەکانی بۆڕیەکانی هەناسەو، چارەیان ئەکات•

**بەشیحەڤدە:** باسینەخۆشیەکانیسینگ وچارەیان ئەکات•

**بەشی هەژدە:** باسی هەمووجۆرە سیلێك و سلۆلیت و چارەیان ئەکات•





مؤسسه انتشاراتی استاد مطهری

**دفتر مرکزی:**

قم ، میدان مطهری خیابان پورزند بعد از سه راه مولوی ،
نرسیده به مسجد رضایی پلاک ۱۹۹ تلفن : ۶۶۳۳۱۸۶

شعبه ۱: قم خیابان ارم ، پاساژ قدس طبقه ٤ پلاک ۱۳۸
تلفن : ۷۷٤۷۱۳۸ شابک : ۶-۰۴-۷۷۳۳-۹۶۴